


پڕۆژەی کتێبی خانەی خەون
کتێبی ژمارە (١٠)

●

بەڕێوەبەری پڕۆژە: **ئەسکەندەر زرار**
سەرپەرشتیاری پڕۆژە: **غەمگین بۆڵی**
**سەنتەری رۆشنبیری خەون**

●

ناوی کتێب: **دەترسم دوای مردنیش کرێکار بم**
بابەت: **شیعر**
ناوی نووسەر: **سابیر هاکا**
وەرگێڕانی لە فارسییەوە: **دلاوەر رەحیمی**
بەرگ و دیزاینی ناوەڕۆک: **ئاکار جەلیل کاکەوەیس**
بڵاوکراوەی: **سەنتەری رۆشنبیری خەون**
تیراژ: **١٠٠٠ دانە**
نرخ: **٢٠٠٠ دینار**
چاپ: **یەکەم**
چاپخانە: **کارۆ**

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان
ژمارەی سپاردنی (٢٠٢) ساڵی (٢٠١٤)ی پێ دراوە

●

■

## پێشکەشە بە:
## کەمەند عەزیزی

■

**دوو تێبینی پێویست:**
یەکەم: ئەم کتێبـەی بەردەسـتتان، وەرگێڕانی کۆمەڵە شیعری چاپی دووەمی(می ترسم بعد از مرگ هم کارگر باشـم)ە، بە ڕێککەوتن لەگەڵ سـابیر هـاکا، من چەند شیعرێکی کورتم وەرنەگێڕاوەتە سەر زمانی کوردی.
دووەم: لە چاپە فارسییەکەدا لە چەندین شوێن، وشە و وێنە و دەربڕین سانسۆر کراوە، من لێرەدا وەرمگێڕاون، هەر بە ڕاوێژ لەگەڵ سابیر هاکا، لە چەند شوێنێکی کەم دەستکاری ناونیشانی شیعرەکانم کردووە.

**دلاوەر ڕەحیمی**

## پەیڤێکی کورت بۆ خوێنەرانی کورد

من کەسێکی نەخۆشم،
ئەمە جۆرێکە لە نەخۆشی کە کەسێک نەتوانی بە زمانی دایکی بنووسێت.
لە کاتێکدا هەر بەو زمانە قسـه دەکات، هەر بەو زمانە دەگریت.
بە هەر حاڵ هەموو کەسێ لە ژیاندا بەربەرەکانێ لەگەڵ نەخۆشییەکدا دەکات،
یان لەدەستی رزگاری دەبێ، یاخود دەمرێت.
هەمـوو هەوڵێک دەدەم کـه رزگارم بێت، چونکە من لە مردن دەترسم.

**سابیر هاکا**

## شتێك وەك پێشەكی
## یان بیۆگرافیای خۆم!

من سابیر هاکام
جگە لە دەردەکان و
کەسانێک کە شیعرەکانم دەخوێننەوە
کەس من بەم ناوە ناناسێت
تەنانەت باوکم!
دەردێک کە دووری خستمەوە لە هەموو شتێ:
لە منداڵیم
دایکم و
شارێک کە لەخۆڕا خۆشمدەوێ و
ئێستا لە باوکیشم گەورەتر بووە.
یەکەمین جار کە بینیم
باوەشی گەرم و میهرەبانی ژنێ بوو
تێگەیشتم باوەشی فێڵی لێ کردووم
کە دایک بانگی بکەم
دایک بۆ من لە خوا و غوربەتیش نامۆتر بوو،
ئەو دەستەکانی گرتم و رایکێشامە ئێرە
تا شەوان لە پارکەکان و نەخۆشخانەکان بەسەر بەرم

یاخود بە تاریکیی جیهاندا پیاسە بکەم...
لە ژێر بارانێ کە خەوی لە چاوانم دەشۆرد و
جگەرەیەک کە تەواو دەبێ
لە خەیاڵی کچێ کە لەبەر
کرێکاربوون لە منیان سەند!
ڕەنگیشە کوردبوون
چەندین جار هەر لەبەر ئەمە لە کار دەرکراوم
چەندین جاریش لەبەر مەزهەب،
خۆیشم نازانم بڕوام بە هیچ شتێ هەبێ
گوێی مەدەرێ،
گرنگ نییە،
هێندە دڵتەنگم کە تەنیا دەمەوێ بگریم
چەند باش دەبوو
ئەو کچەی کە خۆشمدەوێ لەلام بوایە و ئارامی دەکردمەوە
حەز دەکەم ناوەکەیتان پێ بڵێم
بەڵام دەترسم
دەزانم ئازار هێشتایش لەم دەوروبەرانەیە!
ئاه، لەم کاتانەدا

تەنیا  کۆکایەکی سارد دەتوانێ کەمێک ئارامم بکاتەوە.
دڵم بۆ منداڵیم تەنگ بووە
منداڵییەک کە هەمیشە بۆنی ئاسفاڵتی داخ، گاز و
بۆنی ئارەقەی پیاوانی کرێکاری لێ دێ
هەموو شەوێکیش خەو بە ژنێکەوە دەبینێت
کە گریانەکانی مردووەکان بەخەبەر دێنێت!
منداڵێـــک کـــە هـــاورێ نزیکەکانـــی رۆژ بـــە رۆژ دوور
کەوتنەوە
لەم هەموو چارەرەشی و داماوییە!
هێشتاش گرنگی بە رواڵەتم دەدەم
ریشم لە تەوالێتی پارکەکان دەتاشم و دەڕۆمە
کۆڕەشیعرییەکان.
هەر چەند دەزانم کەس نازانێ ئەمە ژیانی منە
بەڵام خوشحاڵم و
شوکری خوا دەکەم
شیعر بیانوویەکی باشە
کە نامبەنە شێتخانە!

## شاتوو

تا ئێستا
بەربوونەوەی شاتووت بینیوە؟
کە چۆن خاک بە سوورییەکەی
سوور دەچێتەوە
[هیچ شتێ وەک بەربوونەوە ئازارهێن نییە]
من کرێکارێکی زۆرم بینیوە
کە لە باڵەخانە بەردەبوونەوە:
دەبوونە شاتوو.

# نیشتمان

بلۆکی پێنج
ژوورێکی بە کرێیی بێ پەنجەرەی شوقەیەک لە
تاران
ئەمەیە
هەموو بەشی من
لە نیشتمان و
ئەمەش
بەتەواوی نائومێدکەرە
بۆ جەنگان لە پێناو نیشتمان!

## شیعرێک بۆ پیاوانی لەحیمچی

پێموایە
خواش کرێکارە!
بۆ نموونە: لەحیمچییە وەک هەموو لەحیمچییەکانی
دیکە و
خۆرئاوابوون؛
چاوانی ئەوە کە هەندێ جار سوور دەبێتەوە و
شەو؛ کراسەکەیەتی
کە پڕە لە کونی ورد و درشت!

## هەر شتێ لە خاکدا بچێنی، نارۆێت

بریا هەرگیز گەورە نەدەبووم و
تێنەدەگەیشتم
باوکم درۆی لەگەڵ کردم؛
هەر شتێ لە خاکدا بچێنی
رۆژێ دەڕوێت
ئەمەش لە دلۆڤانی خوایە!
بۆچی کەس تێناگات
من ساڵانێکی زۆر چاوەڕێ بووم
بەڵام:
دایکم نەڕوا!

## دەرد، قەشمەرێکە بە تەواوی مانا

دەرد، بە هەر شێوەیەک بیەوێت بە پێ و شوێنی
مرۆڤ دەکەوێ
ئەوان گیانیان هەیە
زیندوون
من هەستیان پێ دەکەم
وەک خوا
وەک مەرگ، تەنانەت ساردتر لەویش
یا بە شێوەی تاریکی و ترس لە جلوبەرگەکانم
یا سڵکردنەوە لە بوونی شتێک وەک نەبوونی دایکم
بێکاری و خەمی باوکم،
چی بێ لە تۆ شاراوە عەشقی من
چەندین جاریش بە قەڵافەتی تۆوە بۆ لام هاتووە
باوەڕ بکەن
ئەمە خراپترین قەڵافەتێکە کە دەرد هەیەتی.

## هەژاران دەیئافەرێنن،
## دەوڵەمەندەکان بەکاری دەهێنن

باوەڕ بکەن
ئەگەر تفەنگیان دانەدەهێنا
کەمترین مرۆڤ
لە مەودای چەند مەترێک لەولاتر دەکوژرا و
زۆربەی کارەکان ئاسانتر دەبوو.
ئاسان دەکرا
ئەوانە تێبگەیەنی
کرێکارێک دەتوانێ چەند هێزی هەبێت!

# ژیانی کرێکارێکی شێت

من هرگیز ناتوانم
ببمە کارمەندێکی سادەی بانک،
فرۆشیاری مەوادی خۆراکی،
سەرۆکی حیزبێک
یان شۆفێری تاکسی و
بانگەشەکەری ڕێکلامی شتومەک.
هەمیشە حەزم لێ بوو
زۆر لە سەرووی شارەوە بوەستم و
لە نێو قەرەباڵغی و چڕی باڵەخانەکان
بە دوایماڵی کەسێک بگەڕێم
کە خۆشمدەوێ،
هەر بۆیەشە بوومەتە کرێکار!

## هەموان هەڵە دەکەن
## بەڵام ئەمەیان لێی نەدەوەشایەوە

هەموو بوونەوەرێک لە ژیاندا
تووشی هەڵەگەلێکی قەرەبوونەکراوە دەبێ.
هەندێ کات
لەبەر هەندێ چاوەڕوانی بێهودە،
پتەوترین هاوڕێیەتییەکان لە نێو دەچن و
پەی بردن بە هەڵەی لەدەستدانی شتێ بە دەستی خۆت
زۆر سامناکە،
بەڵام ناتوانی هیچیش بکەی
ڕێک وەک چاوەڕوانییەک کە
خوا لە شەیتانی هەبوو!

## قسەی قۆڕە
## لەو دنیاش کرێکار بیت

هەموو ژیانم لەسەر ئەو باوەڕە بووم
کە درۆ نەکەم.
دڵی هیچ کەسێ نەشکێنم و
ئەوەشم قبوڵکردووە کە لەنێوچوون بەشێکە لە
ژیان،
بەڵام لەگەڵ هەموو ئەوانەشدا
من لە مەرگی خۆم دەترسم
دەترسم دوای مردنیش کرێکار بم!

## بۆ کتێبەکەم

باوەڕ بکە
بە بوێرییەوە دەتوانم بڵێم:
باوکم چێژێکی زۆری لە ژیان نەبردووە
پیاوێکی وابەستە بە خێزان
گیانیشی بەخت دەکرد
تا هیچ کەسێک لە کەموکوڕییەکانی ژیانمان تێنەگات.
ئەوەی کە
باوکم ناتوانێ شیعرەکانم بخوێنێتەوە؛
تەنیا ترسێکمە لە چاپکردنی کتێبەکەم!

# سەدەی بیستەم
# یاخود شێوەیەکی نوێ بۆ خۆکوشتن

لە سەدەی بیستەمدا
هێشتا کەسانێک هەن
کە گرنگی بە ژیانی مرۆڤەکان دەدەن،
بۆ ئازادی
بەیاننامە دەردەکەن،
لە نەتەوەیەکگرتووەکاندا بەرگری دەکەن
لە مافی کرێکاران و
یەکسانی ژنان!
بەڵام لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا
خوێنی زۆر دەبێ برێژرێت
تا باڵەخانەیەک
بە شانازی نەتەوەییی بدرێتە قەڵەم.

## نازانم ئامێرەکان لە کوێوە هاتن، ڕێك وەك خودی ئێمە

ئامێرەکان هیچ هەستێکیان نییە
پیر نابن
شەو کەمەریان نائێشێ
بیر لە کرێ خانوو ناکەنەوە،
لەهەمووی گرنگتر
کۆتایی هەفتە داوای هاوکاری لە خاوەن کارەکەیان ناکەن
ڕێک وەک ئەو ئامێرەی
کە دوێنێ
جێی باوکە پیرەکەمی لە کارخانەدا گرت!

## غوربەت دوور و نزیکییەکەی هێندەی ئاهێکە

هەندێ لە شتەکان
تەنیا لە دوورەوە رواڵەتی ئارام و جوانیان هەیە
مرۆڤیش،
بۆ نزیک کەوتنەوە لێیان، نابێت پێداگری بکات:
وەک عەشق و
سیاسەت و
کۆچ...
من لەسەر باڵەخانە هەوربڕەکان
باڵندەگەلێکی کۆچەری زۆرم بینی
کە چاوەکانیان پڕ لە فرمێسک بوو!

# سیاسەت

هەمیشە هەروابووە
گەورەترین ڕووداوەکان
زۆر بە سادەییی ڕوودەدەن...

هەموو کرێکارەکانیان
گیرۆدەی سیاسەت کرد
لەو کاتەوەی کە
سڵێنگەکان کرانە سێدارە!

## مارکیزیش باوەڕ ناکات
## کە باڵندەکانیش قسە دەکەن

تەنیا لەبەرئەوەی
لە نێو دەستانی کچێک دانەی چنی بوو.
فریشتەکان، باڵەکانیان هەڵپاچی
تا خوو بە زەوییەوە بگرێ.
هەندێ کات
بێئەوەی کەس بزانێ
دەست و پێ بەستراو،
لێیان دەدا نەکا لەبارەی ئازادییەوە شتێ بڵێ
ڕۆژانێکی زۆرە لە هاوڕێیەتی ئێمە دەگوزەرێ
بەڵام ئەوان نازانن
کە ئەو خووەکەی تەرک نەکردووە و
هێشتاش کۆچ دەکات
هەندێ جار بۆ ماڵی من، هەندێ جار بۆ کافەکان.

# بڕیار بوو

بڕیاربوو
باڵندە لەدایک بم،
هێشتا پیاسەیەکم بە ئاسماندا نەکرد،
ئاوازێکم نەچڕی،
دایکم
کۆچی کرد و
تەنیاجێیهێشتم.
بڕیاربوو
درەخت لە دایک بم،
بەڵام پێشتر
درەختێکم دەناسی
لەوەی هەموو شەوێ لە خەونیدا
دارستانێکی سەوز دەسووتا؛ شێت بوو!
بڕیاربوو

ببمە ئاو،
بەڵام پێش من
ڕووبارەکان ڕۆیشتن بۆ دەریا و نەگەڕانەوە
من بیستبووم
ڕووبارەکان منداڵانی دەریان!
نازانم کامە فریشتە
بە هەڵە لە گوێی چەپمدا بانگی دا، کە بوومە
مرۆڤ!
هەنووکە
کرێکارێکم کە ڕۆژانە
لەگەڵ باڵندەکان وەخەبەر دێت
گۆرانی دەچڕێ و
لە سەر باڵەخانە هەوربڕەکان
لەگەڵ فڕۆکەکان

مەشقی فڕین دەکات!
لەگەڵ ئەوەشدا سەخت دڵتەنگم
لەوەی هاوڕێکانم بووبێتنە:
درەخت
باڵندە
یان ئاو!

# مەرگ

نیوەڕۆی ڕۆژێکی پشوو،
لە نیوەی ڕێ
لەکن یەک تێپەڕین
من و مەرگ
ئەو دەچووە شار، منیش بۆ گۆڕستان!

## هۆ

تەنیا هۆیەک کە لەگەڵ خۆدا بەینم نییە
بۆ رابردووی دوور
دەگەڕێتەوە،
ئەوەی کە
شەش سەر خێزانەکەمان
لە ژوورێکی بچووک دەژیاین!
خوداش کە تەنیایە
خانووەکەی لە ئێمە گەورەتر بوو.

## بۆ شیعری کدوی ژول ورنی ڕیچارد براتیگان

بۆ ئاسوودەیی کرێکاران
ئامێرەیلێکی زەبەلاحی زۆریان دروست کرد و،
ئێمەش هێشتا ئاسن و کەرپووچ
لەسەر شانمان دەگوازینەوە،
لەکاتێکدا،
لەسەر ئەم زەمینە
هەموو ساڵێ هەزاران کەس
بەم ئامێرانە لە سێدارە دەدەن!

## دنیای دەرەوەی

دایکم خۆی کوشت
باوکم لەسەر کار دەرکرد
هاوڕێکانم لەبەر پەیداکردنی نانی شەو کوژران و
زۆر کەسی دیکەش
لە کورەکانی مرۆکوژی، سوتێنران!
جەنگ بە شێوەی جۆراوجۆر
لە بوونی هەموو مرۆڤێکدا خۆی حەشارداوە.
هیچ سودێکی نییە
بە دنیای باشتر دڵخۆشمان بکەن
حەوت ملیارد کەس پێ بخاتە هەر جێیەک
هەر ئەم بەزمەیە
کە دەیبینن!

## دونیای دەرەوەی هەسارەی خۆر

کەس لە مندا تێناپەڕێ
کەس لە خەڵوەتی باوێشکەکانم
لە ئامێزم ناگرێ،
نا...
هەرگیز کەس لە مندا
شۆڕش هەڵناگیرسێنێ
بەیانی باش...
من شەقامی دوورخراوەی ژمارە نۆزدەی
شەهید سابیرم!

# ئەو کۆمپرێسەرە لەعنەتییە

باش دەزانم
هەموو بوونەوەرێک لە ژیاندا
موحتاجی هاودەردی و نەوازشە
بەڵام:
بمبورە لەوەی
ناتوانم لە باوەشت بگرم و
فرمێسکەکانت بسڕم
کاتێک کە دڵتەنگی...!
باوەڕ بکە سەختە بۆم
لە بیرکردنی لەرینەوەی ئەو کۆمپرێسەرە لەعنەتییە!

## پێمخۆشە
## لەنێو فرۆکەیەکدا بمرم

خۆم کوشت،
نەک بۆ ئەوەی
ئەفسانەیەک
یان شیعرێک لەگەڵ ناوەکەم دەست پێ بکات،
ژانی من بۆ دایکم؛
گەورەتر بوو لە لەدایکبوون
ژانی ئومێدی گەڕانەوەی کۆترێک
کە دەنووکی لە ئاسمانم گیرکرد و
رۆیشت
تا تۆ
ببیتە نیشتمانی هەمیشەییم...
بەڵام حەیف،
تۆ ناوێکی دیکەی غوربەت بووی،

ئەمەش تەواوی بەسەرهاتی شەقامێکی مەنفایی
بوو
کە دەیزانی
تۆ ناتوانی شارێکی باشبیت
بۆ مردن.

## دوو سێ کیلۆمەتر لە واقیعەت

هەندێ جار دەردە گچکەکان
گەورەترین وێرانی دەخەنەوە!
پاش هەڵەبجە و هیرۆشیما
لە ڕێگەی قوتابخانە
بە پەڕەی کتێبی جوگرافیا موشەکم دروست کرد
کە ڕەنگە - با-
لەگەڵ ئەواندا بمبات بۆ سەرزەمینێکی دیکە
یان نا
ئەم شارە لەعنەتییە تەخت بێت
هەرگیزیش گەمژانە نییە
بە ویست و نەویستراو
هەموو گرێیەکی گچکە دەتوانێ بگاتە کوشتن.








# دایك

دایکم دەیگوت:
مەرگی بینیوە
سمێڵی ئەستوور و
قیافەیەکی وەحشیانەی هەبووە!
لەو شەوەوە
گومانم لە پاکێتییەکەی کرد.

## ژیان هەمیشە لە ئینسان بە قیندا دەچێ

هەرگیز نەمتوانیوە
پیاوێکبم کە باوکم چاوەڕێی دەکرد
پیاوێک وابەستەی خێزان،
یان یارەکەمم خۆشبوێ
وەها کە ئەو دەیویست،
هەرگیز نەمتوانی
ژیانێکم هەبێت کە ئارەزوویم هەبوو،
هەندێ جار تەنیا پارووە نانێک دەتوانێ
حکومەتێک وێران بکات.

## بووکەبەفرینەکانیشیان ناچار بە کوشتن کرد

شەڕ تەواو بوو
هەموو سەربازەکان بەرەو ماڵ گەڕانەوە
تەنیا ئەو بوو
کە نەیدەزانی
بەرەو کام لا بڕوات
هێشتا وەستابوو لە گۆڕەپانی شەڕ
بێئەوەی کەسی کوشتبێت؛
بوکە بەفرینە.

# ترس

دایکم لەگەڵ تفەنگەکەی دەخەوێ
دەڵێت:
پیاو مێژووە
داگیرکەری گەورە،
باوکم
داماوە هێشتا بوێری هەستانەوەی نییە!

## گەمژەیی

ڕۆژانێکی زۆرم لە ژیاندا هەبووە
کە عارەق بڕێژم و
سەخت کار بکەم
بۆ کڕینی کتێبێک کە حەزم لێیەتی...

هەروەتر:
ڕۆژانێکی دیکەش هەبوون
کە کتێبەکانم بفرۆشم
بۆ ئەوەی کەمێک پشوو بدەم!

## عەشق چی لە مرۆڤ ناکات

من دژی ئەوەم
کە عەشق هەموو شتێ بە مرۆڤ دەبەخشێ،
عەشق زۆر خراپترە لە جەنگ،
هەموو شتێ تەفروتوونا دەکات
نیشتمان
خێزان
ژیان
تەنانەت خودی مرۆڤیش
هەر لەبەرئەمەشە کە ساڵانێکە لە غوربەت دەژیم!

# ژیان

پێکەوە دەگریاین
پێدەکەنین
لە یەک دەوریدا چێشتمان دەخوارد
(خەڵکی ئاسایی ئەمەیان بە عەشقێکی گەورە
دادەنا)
لە گەڕەکەکانی خوارووی شار،ماڵێکمان بە کرێ
گرت
بەیانی:
بێئەوەی یەکتر ماچ بکەین
لە ماڵ دەچووینە دەرەوە!
شەو:
بێئەوەی یەکتریی ماچبکەین
ماندوو بۆ ناو نوێن!

(خەڵکی ئاسایی ئەمەیان بە ژیانێکی ئاسایی دادەنا)
بە کورتی
هەر ئەم خەڵکە ئاساییە، دایکمیان...؟!

# مرۆڤ هیچ ڕێگەیەکی لە پێش نییە

هەمیشە لەگەڵ جۆرێ لە بێهودەیی بە ناوی ژیان
دەست و پەنجەم نەرم کردووە
زۆرجار پێش هاتووە
بۆ بەڕێکردنی ژیان
یان یەک ڕۆژ پشوودانی باوکم
یان کڕینی گوڵێک بۆ ئەو کەسەی خۆشمدەوێ
شیعرەکانم بفرۆشم!
جەنگان لەگەڵ هەلومەرجی ژینگەیەک بێ سوودە
ڕێک وەک سەربازێک
ئەگەر هەلومەرجی جەنگ قبوڵ نەکات؛ دەمرێت!

# بارستایی سپی

**یەک**

لەم هەموو جێیە،
لە کوێ دەبارێت
ئەم بەفرە بەدبەختە،
کرێکارەکان
بووکەبەفرینەیان دروستکردووە
لە شێوەی خۆیان!

**دوو**

کڵاوی سەلامەتی لە سەر،
خاکەناسێک لە دەستی،
پێدەکەنین بە
بووکەبەفری کرێکار.

**سێ**

بووکەبەفرینە
کەیفی بە - با- نەدەهات،
دەیگوت:
چەندین کیلۆمەتر لەولاتر هاتۆتە خوارێ،
با
بۆ ئەم شارەی هێناوە!

**چوار**

خوداکەی ئەو میهربان بوو
بۆ چارەنووسی دەگریا
بەڵام:
خوداکەی من هێشتا بێدەنگە!

**پێنج**

کار تەواو بوو
دەستهەقیان دا،
بووکەبەفرینە جانتاکەی پێچایەوە و
تازە تێگەیشت،
کە ئەویش
مرۆڤێکی بێ نیشتمانە.

**شەش**

سالانێکی زۆرە
بەفر دەبارێ
بەڵام هیچ بووکەبەفرینەیەک
بوێریی دروستکردنی کرێکاریان نییە!
لەو رۆژەوەی کە
هەموو کرێکارەکان لە ژێر هەتاودا
دەبوونە ئاو!

## ئومێد

منی دەکوشت
کرێکارێک لە ئەسکەلە بەرزەکانی هاوین،
ئەگەر یادی چاوانی باوکم
کەشی ژوورەکەمی
تەماوی نەکردایە!

## ژیان فیلمێکی قۆڕ و ماندووکەرە

هەندێ کات کە لە کار و ژیان ماندوو دەبم
گریانم دێ و
حەزدەکەم پەنا بۆ تەنیایی ببەم
بەڵام ئومێد دەدەمە خۆم
بە سەبر بم
وادەزانم ئەکتەری فیلمێکی قۆڕ و ماندووکەرم
بە ناوی ژیان.
بە هەرحاڵ
هەموو کەسێ پێیخۆشە
بۆ تەنیا جارێکیش بێ
سەیری فیلمی خۆی بکات!

## پیری سیمایەکی دیکەی مەرگ

ئیدی پەنجەکان هێندە بە پەلە کار ناکەن
چاوەکانم کەمتر دەبینن
هەست دەکەم
جەستەم پیر و بێهێز بوو و
ئیدی کاتی ئەوە هاتووە لەماڵەوە بمێنمەوە
ئێواران بڕۆمە پارک
هەندێ رۆژیش بۆ گۆڕستان و
بۆ ئەو رۆژانەی کە رابردن
بگریێم
مرۆڤ کاتێ پیر دەبێت
بە دڵنیاییەوە پەی بە مەرگی خۆی دەبات
رێک وەک هەموو حکومەتەکان!

## ڕووتیت

بمبورە
ناتوانم لە ئامێزت بگرم
چونکە
بۆ مرۆڤێکی بێ نیشتمانی وەک من
ڕووتی تۆ،
ڕووتی ئەستوونی باڵەخانەکانم
بیر دەخەنەوە.

# خۆکوشتن خودی شیعرە

دواجار لە باڵەخانەکەدا خۆی هەڵدا
کرێکارێک
کە عاشقت بوو.
لە دەستێکیدا مشتێک هەور
لە دەستەکەی دیکەشی...

چەند مەترێکی مابوو تا زەوی
تێگەیشت مرۆڤێکی شاعیرە!

## دڵتەنگی

ئەوێ شەوێ
چەند خەمناک بووی!
کلۆیەک بەفری گچکە
لە ئاسمانی چاوانت باریی...
هەورەکان
تازە تێگەیشتن کە ئی دی نابارن!

# شیعرێك بۆ خۆم

لە هەموو شتێک تێگەیشتم!
ماوەیەکە تووشی ماسینی جومگەکان بووم،
بازووەکانت
تەنیا ئومێدم بوون،
راوەستم
رێ بکەم،
وادەزانم شێت بووم
باڵندەکان لەم سوچی ژوورەکەمەوە
بۆ ئەو سوچی دیکە کۆچ دەکەن،
خۆر لە گیرفانی کراسەکەم هەڵدێ و
مانگیش لە کونی قاڵی ئاوا دەبێ،
هەورەکان دێن
لە پەرداخی بەتاڵی سەر مێزەکە دەبارن و
دەڕۆن،

دڵتەنگی تۆم
دەرگەکە دەکەمەوە،
شار پڕ بووە
لە بۆنی باروت و دڵەخورپێ،
لە بۆنی تەرمی ئەو سەربازانەی چووبوونە جەنگ،
پەنجەرە دەکەمەوە،
کێوەسەهۆڵییەکان دەتوێنەوە
ئاو سەر دەکات
بەرەو ژوورەکەم،
کە خەوم لێدەکەوێ
لەهەر سنوورێک کە تێدەپەڕم
دەگەرێمەوە بۆ ژوورەکەم،
هەڵدەستمەوە
لە گەرمای کەمەرەی زەوی،




ئاه
لێرە نیت
بە سەرپۆشەکەت
ئارەقە لە ناوچاوانم بسڕی،
گوێی مەدەرێ
دونیا هێندە گچکە بووبێتەوە
شێتیش بیت
سەرسوڕهێنەرە،
دونیا کە گەورەتر بوو
زیاتر تۆم دەبینی!

## بەفر

بەفر سەر زۆربەی شتەکان دادەپۆشێت
وەک تەرمێک کە لە کفن دەیچێتەوە!
سەر ئەستوونی باڵەخانەکان
درەختەکان
قەبرەکان
بەفر،
تەنیا بەفریشە
کە دەتوانێ سنوورەکان داپۆشێ!

# یەکەمین ڕۆژی ژیانی پاش مەرگ

ئەگەر ڕۆژێ بمرم
هەموو ئەو کتێبانەی خۆشم دەوێن
لەگەڵ خۆمیان دەبەم
گۆڕەکەم پڕ دەکەم
لە وێنەی ئەو کەسانەی خۆشم دەوێن.

بێئەوەی هیچ ترسێکم لە دواڕۆژ هەبێ
ڕادەکشێم
جگەرەیەک پێ دەکەم و...
دەگریێم؛
بۆ هەموو ئەو کچانەی حەزم دەکرد لە باوەشیان
بگرم.

بەڵام لە نێو هەموو چێژێکدا
ترسێکی گەورە خۆی حەشارداوە
ترس لەوەی
بەیانی زوو کەسێک شانت ڕاوەشێنێ و بڵێت:
- هەستە سابیر!
دەبێ بڕۆینە سەر کار...

# نیشتمان

دەتوانم بە تەواوی جیهان بڵێم
بە تەواوی سەرزەمینەکان و
ئاسمانەکان
بە هەموو شتێکی ئەم جیهانە دەتوانم...
تەنیا بەم ژوورە
بە کرێ، بێ پەنجەرەیەی، شوقەیەکی تاران
ناتوانم بڵێم؛
نیشتمان!

## دونیا زۆر نەگۆڕاوە

ماوەیەکە
پۆلیس بە دوامدا دەگەڕێ
بێئەوەی
کەسێکم کوشتبێ
یا وتارێکم دژی دەوڵەت نووسیبێ.
ئازیزم
تەنیا تۆ دەزانی
چەند خەمهێنەرە بۆ گەلێ
کە دەوڵەتەکەی لە کرێکاربوونم دەترسێ
چ بگا بەوەی
شۆڕشگێڕ
یاخی
یان شتێکی دیکە بم.
لەگەڵ ئەوەشدا دەزانم

دونیا زۆر نەگۆڕاوە
بۆ کوڕێک
کە هەمیشە پێی خۆش بوو
لاپەڕەی یەکەمی هەموو کتێبەکانی قوتابخانەی
وێنەی خۆی بێت.

# تەنیا خزمەتکارەکان لە دەرکردن دەترسن

هیچ کرێکارێک لەوەی کە رۆژێ دەربکرێ
ترسی نییە!
وەستایەکی بینا دەتوانێ
لە شیرینی فرۆشییەکدا بە لێزانییەکی
سەرسورهێنەر
شیرینییەکان لەسەر یەک هەڵچنێ.
قاڵب بەندێکیش دەتوانێ
لە بازاردا سەرقاڵی پرپیشک دروست کردن بێت،
لەحیمچییەکی ئەسکلێت دەتوانێ
پەلهەوانێکی لێهاتووی لێدەربچێ
کرێکارێکی سادەش دەتوانێ
خاکەناس و زەنگن هەڵگرێ و
لە گۆڕستان قەبر بۆ خەڵک هەڵکەنێ!






# تویێشووی کرێکاران

کرێکاران
ژیانی سادە و
ژنی جوانیان هەیە.
ئەوان رۆژانە
لەدوایی کارەکەیان
لە باڵەخانە هەوربڕەکان
هەوری سپی نوێ
دەبەنەوە ماڵ!

## تەنانەت مارکسیش
## ڕقی لە هەندێك کرێکار بوو

کرێکاری کارێکی شەرافەتمەندانەیە
مرۆڤ نانی قۆڵ و بازووی خۆی دەخوات
هەرچەندە زۆربەی کاتەکان
برسیی بووم
درۆ و جنێوم بیستووە
بێکار بووم،
بەڵام هەرگیز ئامادە نیم
لە تەلارێکدا کار بکەم کە بڕیارە
لەسەر دەرگاکەی بنووسن:
زیندانی ناوەندی.

# تەنها شەڕ دەتوانێ یاساکان بگۆڕێت

باوکم
بۆ پارووە نانێکی مەمرەو مەژی
شەو و ڕۆژ کاری دەکرد و
باوەڕی وابوو:
ئابڕووی پیاوێک لە گرەوی ئەمەدایە خێزانەکەی
سکیان تێر بێت و
خراپترین کاری دەوڵەتێکیش ئەمەیە
کە خەڵکەکەی برسیی بن!
بریا دەکرا یاساکان بگۆڕدرین
تا کرێکاران بتوانن ببنە کاندیدی سەرکۆماری!

# ویژدان

هەرگیز لە خۆم خۆش نابم
لەبەر ئەو کارە هەڵانەی کە کردوومن
لایەنی کەم
گەر من کارم نەکردایە،
شار هێندە گەورە نەدەبوو
تا ماڵی ئێوە
بۆ گەڕەکێکی دوورتر بار بکات.

## ئازادی هەرگیز بزەیەکی پێنەخشیوین

هەرگیز ئامادەنیم
لە پێناوی ئازادیدا بکوژرێم یا بخرێمە زیندانەوە!
ئازادی هەمیشە وێرانکەر بووە.
سنووردارێتی، سیمای هەندێک لە شتەکان گەورە
دەکات
کەس تێناگات
من زۆرجار موحتاجی ئازادی بووم
بچووک هەر هێندەی خۆشویستنی تۆ!



# بڵاوکراوەکانی خانەی خەون

## (سەنتەری ڕۆشنبیریی خەون)

| ژمارە | کتێب | بابەت | نووسەر | وەرگێڕ |
|---|---|---|---|---|
| ١ | هەناری ڕەش | شیعر | بژار حەکیم | |
| ٢ | رووتبوونەوەی وشەکان | شیعر | غەمگین بۆڵی | |
| ٣ | گوزارشتی خود | لێکۆڵینەوە | سۆران ئازاد | |
| ٤ | وڵاتی کوێران | ڕۆمان | هێربێرت جۆرج وێلز | شۆڕش غەفووری |
| ٥ | خولیاکانی ئەو، باویلکە غەمگینەی لە باشوورەوە، هاتبوو | شیعری وەرگێڕدراو | سەید عەلی ساڵحی | م. ساماڵ ئەحمەدی |
| ٦ | پەنجەکان شتێک دەڵێن | چیرۆک | فەرهاد چۆمانی | |
| ٧ | پاڵەوانە کارتۆنییەکە | شیعر | نارین | |
| ٨ | جیۆڤانی ئیپیسکۆپۆ | ڕۆمان | گابریلە دانونزیو | جەبار سابیر |
| ٩ | ماڵێک نزیکی دەریا | شیعری وەرگێڕدراو | محەمەد ماغوت | ڕزگار عومەر |

